# چەند نەگۆڕێك لەسەر ڕێبازی جیهاد دا ؛

- ئەڵقەی چوارەم —

-شیخ یوسف العییري؛ ڕەحمەتی خوای لێبێ

## نەگۆڕی چوارەم

## جیهاد پەیوەست بە شەڕێکەوە نییە

یەکێ تر لەو ئافەت ودەردانەی لە دڵ ودەروونی زۆرێك لە خەڵکدا بەرامبەر بە جیهادەوە داکوتراوە پەیوەست کردنی جیهادە بە شەڕێکەوە، کە سەرکەوتین دیارە کە دەستپێك وبنەماکەمان دروست بوو، وکە شکستیشمان خوارد ئەوە ئیتر دەستپێك وبنەمامان چەوت ونادروستە. ئەم جۆرە بڕوایەش هەم لە شەرع وهەم لە عەقڵیشدا باتڵەو، سەرەنجامی ڕووخانی دەروونی وکەم ئیمانی وبێ سەبرییە.

ئەگەر لە ڕووی عەقڵەوە شیکەینەوە: ئەوە هیچ پەیوەستەیەکی عەقڵی ولۆژیکی لە نێوان دەستپێك وئەنجامدا نییە، شکستی ئەنجام قەت بەڵگەی چەوتی وباتڵ بوونەوەی دەستپێك وبنەماکان نەبووە.

ئەگەر لە ڕووی شەرعیشەوە بێت: ئەوە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - وەك لە سەحیحدا **هاتووە** دەفەرموێت: "عُرِضَت عَلَيَّ الأُمَمُ فَجَعَلَ النَّبِيُّ والنَّبِيّانِ يَمُرُّونَ مَعَهَمُ الرَّهْطُ والنَبِيُّ لَيسَ مَعَهُ أَحَدْ" - خوای پەروەردگار ئوممەتانی پێ نیشاندام، پەیامبەر ودوو پەیامبەرم بینی بە خۆیان وکۆمەڵە خەڵکێکی کەمەوە تێدەپەڕین، وپەیامبەری وا هەبوو کەسی لەگەڵدا نەبوو - .. سەیر دەکەی ئەو پەیامبەرەی کەسی لەگەڵدا نەبوو بانگەوازەکەی بە هیچ ئەنجامێك نەگەیشتبوو، کاتێك کە هیچ کەسیش لەگەڵی موسوڵمان نەبووە بەڵگەی ئەوە نییە بانگەوازەکەی چەوت بوو ویاخود لە کات وشوێنی گونجاودا ڕەوانە نەکرابوو - حاشای خوای پەروەردگار -، ئەوەش تەنها مرۆڤێك زەندیق بێ لەو بڕوایەدایە.

لە مێژووشدا شەڕی وامان هەن موسوڵمانان وا شکستیان هێنابوو مرۆڤ کە سەیردەکا خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێ کە چیتر ئیسلام نوێ نەبێتەوە، یەکێك لە سەخترین ئەو شەڕانەی ئیسلام وموسوڵمانان شکتیان لێ هێنا شەڕی تەتار بوو کاتێك لە ساڵی ٦٥٦ کۆچیدا وڵاتی عێراق وشامیان تەنییەوەو، لە عێراقدا لە ماوەی چل ڕۆژ زیاتر لە ملیۆنێك مرۆڤیان کوشت، واتە بە ئەندازەی ٢٥ هەزار نەفەر لە هەر ڕۆژێکدا. فەساد وخراپەشیان لەوە زیاتر درێژەی کێشاو وڵاتی ئیسلامیان لوولداو لە هەر شەڕێکیان بەرامبەر بە موسوڵمانان سەرکەوتن هاوەڵی ئەوان بوو، بەڵام کە خوای پەروەردگار موسوڵمانانی پاك کردەوەو ڕوویان لە پەروەردگار کرد ودەستی پاڕانەوەیان بۆ بڵند کردەوە؛ تەتار وموسوڵمانان لە شەڕی "عین جالوت" دا کەوتنە بەرامبەر یەك ولەوێدا تەتار شکستیان خوارد، لەگەڵ ئەوەی لە شەڕانی پێشوودا سەرکەوتبوون وهێشتا بە هێزتر بوو بوون، وموسوڵمانانیش لە بەرامبەردا ئەوەندەی تر لاوازی ڕووی تێکردبوون، ئەگەر بەراوردی کەین لەگەڵ کاتی پێش کەوتنی بەغدا بە دەست تەتارەوە. لە سەرەتای سەدەی سێیەمی هیجریشدا کاتێك کە "قرامطة"ەکان وڵاتی عێراق وحیجازیان گرت حاڵی موسوڵمانان هەر بەو شێوەیە بوو، پێشتریش لە ئوحود دا کاتێك کە موسوڵمانان لە بەرامبەر کافراندا شکانو، دواتر تووشی ناخۆشی وتەنگانە بوون ولە شەڕی ئەحزاب دا هەژان وتووشی لەرزە هاتن، بەڵام دواتر

لەو شەڕانەی لە پاش ئەحزاب دا هاتن ومەزنترینیان فەتحی مەکە بوو سەرفراز بوون وسەرکەوتیان بەدەست هێنا.

بۆیە بەستنەوەی جیهاد بە شەڕێکی تایبەتەوە یەکێکە لە گەورەترین ئامرازەکانی شکستی دەروونی وئامرازەکانی لاوازی موسوڵمانان لەمڕۆدا، چونکە ئێمە نە لە کۆن ونە لە ڕۆژگاری ئێستاشدا بە زۆری وتوانامانەوە ڕووبەڕووی دوژمنانمان نەبووینەتەوەو، هیچ کاتیش ناکرێ لە شەڕەکانماندا پشت بە تەرازوو وئەژماری مادییەوە ببەستین، بۆیە هەر کات هەوڵی خۆمان لە ئامادەکردندا خستەگەڕ وخۆمان ماندوو کرد با شکستیش بێنین ئەوە لەبەردەم پەروەردگاردا خۆمان بەری کردووە. بەستنەوەی سەرکەوتنی ئیسلامیش بە شەڕێك وبە جەنگێکی تایبەتەوە لەوانەیە بگات بە نائومێدیو وازهێنانی مرۆڤ وئوممەت لە جیهاد بە هۆی ئەو شکستەوە، لەگەڵ ئەوەی ئێمە بە ژمارەو بە توانای خۆمانەوە شەڕ ناکەین، چونکە لەوانەیە لە شەڕێکدا لە دوژمن زۆرتر بین وپێگەمان لەو باشتر بێت، بەڵام مەرجە ئیمانییەکانی سەرکەوتنمان نەهێنابنە جێو خوای پەروەردگار بە شکست تاقیمانکاتەوە، بۆ ئەوەی دەروونمان پاك بێتەوەو ڕیزەکانمان یەکلابنەوە. کاتێکیش کە پێوەری مادی لە شەڕدا دەکەینە دادوەر وهیواو ئاواتی خۆمانی پێ دەبەستینەوە، هەر کات سەرەنجام شکست بوو دڵ ودەروونیش نائومێد دەبن وهیممەت دادەبەزێتو جیهاد لە کار دەخرێت. بەڵام ئەوەی دروستە کە جیهاد بۆ ئەوە بکەین چونکە عیبادەتێکە لە شانمان خراوە چ سەرکەوین وچ شکست بێنین.

لە کۆتایی ئەم ئەڵقەیەشدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم، کەوا دەترسم قسەکانی پێشووم وا دەرخەن کە ئەو شەڕەی ئیسلام وکوفری جیهانی لە ئەفغانستان بە کەم بزانم، نەخێر، بەلکو شەڕی ئەفغانستان هەر ئەوە نییەو لە دوای خۆشیدا زۆری هەیە لەسەری تەرتیب بێت، کە لەو شەڕەشدا سەرکەوتین ئەوە موسوڵمانان لە بەندایەتی ئەمریکا ورۆژئاوا ڕزگاریان دەبێتو، گەر قەدەری خوای پەروەردگار شکست

خواردن بوو لەو شەڕە ئەوە ئاواتی گەورەی موسوڵمانی ڕاستگۆ لە هەر شوێنێکی جیهاندا ئەوە دەبێ هەر بمردایەو لە یاد چووبایە، کە پێشبینی ئەو لووتبەرزی وستەم وزۆرە دەکات لە وڵاتی موسوڵماناندا بە دەستی ئەمریکا دووچاری موسوڵمانان بێتەوە. بۆیە شەڕی ئێمەو کوفر لە ئەفغانستاندا شەڕێکی گرنگ ویەکلاکەرەوەیەو، پێویستە هەموو ڕێگەیەك بگرینە بەر وتەواوی هێز وتوانامان لەو شەڕەدا بخەینە گەڕ بۆ ئەوەی بە کۆمەك ویارمەتی خوای پەروەردگارەوە سەرکەوین وبراوە بین. ئەمەو قسەکانی پێشووم دەربارەی پەیوەست نەکردنی جیهاد وسەرکەوتن بە شەڕێکەوە لازم وبەندی یەکتر نین، چونکە هەر کەس بەو تێگەیشتنەوە بەشداری ئەو شەڕە بێ - واتا بەوەی جیهاد بە شەڕێکەوە پەیوەستکا - ئەوە شکانی لەو شەڕەدا واتا نەمان یاخود لاوازبوونی جیهاد دەگەینێت، جا ئەو هەستەی لە گوفتار وکردارەکانیدا دەربڕێ یا هەر لە نێو خۆیدا بیشارێتەوە.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧